ناوی کتێب: لە ژێر ئاسمانی شیعردا
نووسینی: چەند نووسەرێك
وەرگێڕانی : عیسا چیایی
بابەت: شیعر
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەری: سەیران عەبدولرەحمان
سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق
ژمارەی سپاردن : ٥١٥ ی ٢٠٠٥
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠٠٥
کوردستان -سلێمانی
www.sardam.info

**خوێنەری خۆشەویست :-**

..ئەم هەڵبژاردەیەی بەر دەستت، پرۆژەیەکی وەختیی نی یە کە لەکاتێکی دیاریکراودا ئەنجامم دابێت ، بەڵکو کارێکی لەسەرخۆ و شێنەیی بووە کە دەستم پێ کردووە، بەهیوای ئەنتۆلۆگیایەك نەبووم بەقەدەر ئەوەی :-ڕەنگە پرۆژەی وەرگێڕانی هەریەکێ لەم شیعرانە ، گێڕانەوەی تارمایی خەمێکی لەدەست چووم بن و ئەو هەستی قەرەبوو کردنە بە ویژدانێکی شیعریەوە وەریگێڕابێتن کارێك بووە ، دەبوو من یان هەریەکێکی تر پێی هەستێ . لەکۆتایی ساڵی (١٩٩٠)ـەوە ، و بەدیاریکراوی بە شیعری ((نووشتانەوە و بازنە ))ـەی (مەحمود دەروێش ) دەستم پێ کردووە .

عیساچیایی

دەربەندیخان

کۆتایی ساڵی (٢٠٠٣)

## شاعیرەکان

1- ئەدۆنیس
2- ئۆکتاڤیۆباز
3- تێدهیوز
4- محمود البریکان
5-میرۆسلاڤ هۆلۆب
6-محمود دەرویش
7 - فوئاد ڕفقه
8- مشتێ هایکۆی یابانی
9- یوجین گیلفك
10- سەلاح ستیتیه
11- ئەغنسینۆ نیتۆ
12- ئیبراهیم قازۆ
13-لیۆن فیلیپ
14- سان ژۆن پێرس

## (( ئـــــەدۆنیس )) *

ناوی ( علی احمد سعید ) له سوریا له دایك بووه، بەڵام زۆربەی ژیانی له تاراوگەدا بەسەربردووه جگه له شیعر نووسینی فکری ڕەخنەیی دەنووسێ، نووسینەکانی گفتوگۆو ڕەخنەن له شیعرو فکری عەرەبیو ڕۆژئاوایی، دەورێکی باڵای هەبووه له گۆڤاری (شعر)ی لوبنانیو پاشان له گۆڤاری (المواقف)دا.

ئەمه هەندێك له بەرهەمەکانیەتی :

⋆قصائد اولی .

⋆اغاني مهيار الدمشقي .

⋆/ديوان الشعر العربي /دراسات

⋆/هذا هو اسمی/ ئەم چامەیه بە سەرەتا و پێچکردنەوەیەکی گرنگ دادەنرێت لەمێژووی شیعری عەرەبیدا، چەند ساڵێکه کاندید کراوه بۆ خەڵاتی نۆبڵ .

...ئەوە منم
وەك گوڵێك لە گیانەڵا دابێت
لەزنجیرەی باب و باپیرانم دەردەچم
شەپۆل دەدەم ودەژمێردرێم .
لەهەنگ دەچم وهەنگوێنی تایبەتیم دروست دەکەم و
ئەوەش ژیان سارد و کەمترە لەوەی
کە برینێك بێت، چ نابینم، ئامێر نەبێت ئاپوورە دەکەن
دەورووژێنە کێلگەیەکەوە لە هەناسەی مرۆڤ
شتێك نی یە کە شەو یان ڕۆژ بێت
بەڵکو شریتێکە لەچرکەکانەوە دەگات
دەپچڕێت..
نە دەرەوە ماڵی منە ..و
ناوەوەش تەســـــــك وتروسکە بۆ من
لەزنجیرەی باب وباپیرانم دەردەچم
وەك بۆنی گوڵێك لەگیانەڵڵا دابێت.
نـامەوێ نـاوبنرێم/دەمەوێ ناوێك بم بۆ ڕووناکی..
نـامەوێ بگیردرێم/دەمەوێ هاو واتای((بـــا))بم

## (( ژنت ژ نــــۆ ))

★-لەکوێ بووی ..؟
چ ڕووناکیەك لەژێر پێلوەکانتدا دەگری ..؟
لـــــــــــەکوێ بووی..؟
پیشـــــــــــانم بدە چیت نووســـیوە ..؟
وەڵامیم نەدایەوە ..ووشـەیەکم نەدەناســـی
من کاغەزەکانم دڕاند ..چونکە
لەژێر هەوری مەرەکەبدا
ئەســتێرەیەکم نەبینی ..
★-چ ڕووناکی یەك لەژێر پێلووەکانتدا دەگری ..؟
لە کوێ بووی ..؟
وەڵامیم نەدایەوە
شـــەو کوخێکی کۆچەران بوو....و
چراکان خێڵێك .
منیش خۆرێکی لاواز
لەژێریا زەوی هەواری خۆی دەگۆڕی ..و
کابرای وون بوویش بە ڕێگا دوورەکەی دەگەیشت....

★★★

## (( ڕۆژێ کە بێتە وڵاتم ))

....وا من بەسەر بەیانیانی وولاتەکەمدا
بەسـەر پاشماوە و بڵندایيەکانیدا ،
هەڵدەزنێم و ســـەردەکەوم
وامن لـەقورســــــایی مەرگ لە نێو وولاتەکەمدا
ڕزگارم دەبێ
وا من لێی نامۆ دەبم
هـەتا ببینم
چونکە ســــــبەینێ ڕەنگە ببێتە وولاتم ..

## (( ئەندێ ژ ژ ئەم لەچانەی .ڕژنا ژژ ژ نۆم ))

★بەتەنیا دەنووستم لەترسی ئەوەی
نەوەك تەنیایی بە جێم بهێڵێ ..
★ناكرێ جوان كردنی دنیا كۆتایی پێ بێت
چونكە ئەو كات دنیا كۆتایی دێت ..
★هیچ شتێك نایەوێم
چونكە من هەموو شتێكم دەوێت .
★مەرگ نزیكە
چونكە – بیر-ە نەك جەستە .
★ئەڤینیش دوورە
چونكە جەســـــتەیە نەك – بیر...
★كێوێكی سەر بەتەم داپۆشراو
پیاوێكە سەركێشی دەكات
★دارستانێكی سەر بەتەم داپۆشراو
ژنێكە خەون دەبینێ..
خەون كەناری ناخودایەكە
ناكەوێتە ڕێ ...
لەگەڵ ئەوەش دا من سەر بە خەونم
★یادەوەریت لە هەموو چركەیەك پاك بكەرەوە

کە نەیزانی پێشوازیت لێ بکات .

★-ئەم دارە ســـــڵاوەکەی نەسەندمەوە

ئایا لەبەر ئەوەبوو

کە پێش ئەو ســـــڵاوم لە.بـا..کردبوو...؟

★-دڵتەنگیم شـەو دەپۆشێت ..و

بە ڕۆژ هیچ پۆشاکێکی نی یە ..

ڕێگا هێمای خۆشـــبەختیە

چونکـە ئەو تێپەڕینێکی هەمیشەییە ..

★-ئـــاو عاشـــقێکی ئەبەدییە .

لــــەبەر یەك هۆ :

تێشــــــــکان نازانێت .

★-مەرگ خودایە و هەم شەیتانیشە

بــــــۆیە کەس خۆشی ناوێت .....!

## ((ئۆ کتا ڤیۆ پاز ))

....ساڵی (١٩١٤)لەمەكسیكۆ له دایك بووه، ساڵی (١٩٣١)چالاكی ئەدەبی دەست پێ دەكات و گۆڤاری (باراندال) دادەمەزرێنێ، ساڵی (١٩٣٣) كوڕاساتی دۆڵی مەكسیكۆ ، دادەمەزرێنێ و یەكەمین دیوانە شیعری بەچاپ دەگەیەنێ بەناونیشانی (مانی دەشتاییەكان /قمر البراری ). ساڵی (١٩٣٧) میگل ارناندیس و رفائیل البیرتیو نیرۆدا و فالیخۆ دەناسێ و هەردوو دیوانی (سەرەتای مرۆڤ و لەسایەی شەبەنگی ڕووناكتدا ) بلاو دەكاتەوە كە شیعرەكانی دەمی لاوێتین. ساڵی (١٩٣٨) پاش گەرانەوەی لەئەسپانیا دەخزێتە كاری ڕامیاریەوە.(١٩٦٠) دیوانی(سەربەستی مەرجدار)بلاودەكاتەوە. ساڵی (١٩٥٧) گرنگترین بەرهەمی چاپ دەكرێت (بەردی هەتاو).

ساڵانی (١٩٦٢/١٩٦٨)سەفیری مەكسیكۆ دەبێ لە نیودەلهی كە بەبەرهەمترین ماوەی ژیانی دادەنرێت. ساڵی (١٩٦٨) دەست لەكار دەكێشێتەوە وەكو نارەزاییەك بەرامبەر ئەو قەسابخانەیەی دژ بە خوێنكارانی مۆسكۆ ئەنجام درا. لەزانكۆكانی ئەمریكاو بەریتانیاو ئەمریكای لاتینی دەرسی وتۆتەوە .

## ١-((دژ جەســــــــــتە ))

...دوو جەستەی بەرامبەر
هەندێ جار دوو شـــــەپۆلن و
شــــەویش بەدەوریاندا ...زەریایە ..
دوو جەستەی بەرامبەر
هەندێ جار دوو بەردن .....و
شەویش ...بیابان
دوو جەستەی بەرامبەر
هەندیٚ جار دوو تیژەکن
شـەویش بڵاچـە..
دوو جەستەی بەرامبەر
هەندێ جار دوو ئەستێرەن و
دەڕژێنە ئاسمانێکی بەتاڵەوە ....!

## ٢-((بەردی بنەڕێت ))

..ڕووناکیی بەرزاییەکان ،دادەگرێتەوە
مێگەلی ئیمپراتۆرە بەزیوەکان
ئابلۆقەی ڕووناکی توند دەبێ وچاو دەگەڕێتەوە
سەهۆڵبەندانێکی پان و بەرین وەکو بیداری
بەرد و زیخ وەکو ئێسکی مردوان
پایزێکی بێ تخوب
تینوێتی سەرچاوە نەبینراوەکانی دەتەقێنێتەوە
خۆیەتی دوا((بیریۆ)) یە لە بیابانەوە، مژدە دێنێ.
چاوەکانت داخە و گوێ لەسروودی ڕووناکی بگرە :
باڵندە کۆچەرەکە لە تەپڵی گۆیچکەتدا
هێلانەکەی، چێ دەکات .
چاوانت داخە و بیان کەوە :
هیچ کەس نیە ..و تەنانەت .تۆش
هەر شتێك بەرد نەبێت ...ڕووناکی یە ...!

## (( تێد هیوز ))

..ساڵی (١٩٣٠) لەگوندێکی بچکۆلەی ولایەتی یۆرکشایر لەدایك بووە ، ئەو گوندەی کە زۆربەی دانیشتووانی لە جەنگی جیهانی یەکەم دا تیاچوون. ساڵی ١٩٥٧ دیوانی (بازێك لەژێر باراندا) چاپ دەکات، ساڵی ١٩٥٦ سیلڤیا بلاس دەخوازێت ژنەکەی خۆی دەکوژێت .

قەلەڕەش ناوی یەکێکە لە بەناوبانگ ترین بەرهەمیو ئاماژەیەکە بۆ ڕەشبینی ماوەیەکیش شاعیری بیلاّتی پاشایی بەریتانیا بووە .

ئەندرۆمۆشن مامۆستای نووسینی داهێنەرانەی زانکۆی (ئیست ئەنگیا) وپانزە ساڵە هاوڕێی هیوزە جارێکیان ووتی ((مرۆڤ بەختەوەرە ئەوکاتەی لە زەمەنێکدا بژێ کە چامەکانی (تێد هیوز )ی بەدووای یەکدا تیا بلاّودەبێتەوە ئەوە خۆشبەختیەکە هیچ خۆشبەختیەك پیا ناگات )) ..

## ١-(( ئـــــەڵ ))

...★ کێ گەڵاکانی کـوشت..؟
-ســــــێو دەڵێ من
فوودراو وەکو نارنجۆك ، یان تەقینەوەی بۆمبێك
هەموویانم کوشـــــــت،
من هەموویانم کوشت...
کێ دەیبینێ کە هەڵدەوەرێ..؟
-هەرمێ دەڵێ ..من ،بەرووتی جێم دێڵێ
هەموو خەڵك دەمبینن و دەستم بۆ درێژ دەکەن
من دەیبینـم کە هەڵدەوەرێ ..
کێ خوێنەکەی هەڵدەگرێ..؟
- کوولەکە دەڵێ ،من .. من
عەرەبانەیەکیان دەوێ ومنیش درێژکۆلە دەبم
من خوێنەکەی هەڵدەگرم ...
★کێ کفنەکەی بۆ دەدروێ ..؟
-پەرەسێلکە دەڵێ من
پێش ئەوەی شتـەکانم کۆ بکەمەوە و کۆچ بکەم
کاتێکـــــی وام هەیە

من کـــــفنی بۆ دەدرووم ..
کێ گۆڕی بۆ لێ دەدا ..؟
- ڕووبار دەڵێ من کە هەڵدەچم
بەهێزی شـــــــەپۆلەکانم گۆڕێکی ڕەشـتاڵە .و
قـــوولی بۆ لێ دەدەم ..
*کـــێ دەبێتە قەشە ..؟
-قـەلە ڕەشکە ، دەڵێ ، من
هەمووان دەزانن کەبە توانایەکـی باشەوە
ئینجیل دەخوێنم .
*کــــێ شــــینی بۆ دەکـــــات..؟
- بـــــــا.دەڵێ ، من
بەســــــەر گژوگیادا دەقیژێنم
کە تێپەڕ دەبم ، خەڵك زەرد هەڵدەگەڕێن ..و
هەڵــدەلەرزن،
مــن، شینی بۆ دەکەم . . .
کـــێ تابووتەکەی هەڵدەگرێ ..؟
-خۆر نشین، دەڵێ :من
هەموو جیهان دەگـــری
کە دەمبینن دادەبەزمە نێو قووڵایی
مـن، تابووتەکەی ، هەڵدەگرم ..
کـێ دەیلاوێنێتـەوە ..؟

-خـــەرماشە  دەڵێ: من
بە هارِەی تراکتۆرەکەم
خاك ، هەڵدەدرِم و لاواندنەوە ، دەچرِم
مـــن دەیلاوێنمەوە ..
کـــێ زەنگ لێ دەدات.؟
-بووکە سوورە دەڵێ :مـــــن
ســـــــــترانە تشرینیەکانم
هەوالّــی  کۆتایی گەڵاکان  دەدەنە
بــــــاخچەکان ..
مـــــــن زەنگ لـــــــێ دەدەم ...

## ٢-(( گۆرانـــــی قەلەڕەش لەبەر خۆیەوە))

..کاتێ خودا ..قەلە ڕەشی دروست کرد
ئاڵتوونی داهێنا ..
کاتێ خودا ..قەلە ڕەشی  بەخۆر سووتاند
ئەڵماســـی داهێنا.
کاتـێ خودا ..قەلە ڕەشی پارچە .پارچە کرد
پارەی داهێنا
کاتێ خودا ، قەلەڕەشی هەڵدایە بەرزایی
ڕۆژی  داهێنا
کاتێ خودا ، قەلەڕەشی بە داردا هەڵواسی
میوەی داهێنا
کاتێ خودا،  قەلەڕەشی بە خاکدا  چەقاند
مرۆڤی داهێنا
کاتێ خودا ، ووتی :- (وا بردمەوە ئەی  قەلەڕەش)
فریادڕەسی داهێنا
کاتێ خودا، لەبێهودەییەوە سەری دەرچوو
قەلە ڕەش دەنووکی دەر هێنا و بە قووڵیی ئاوڕی لە
دزەکان دەدایەوە...

★★ ★★ ★★

## ((مد نود البرز نا ز))

له بەسره لەدایك بووه، پێش ئازادی عێراق ،له كەشێكی تەم و مژاویدا له لایەن پیاوانی ڕژێمی پێشووترەوه شـــەهید كراوه، شاعیرێكه به گۆشەگیریی وكەم ووتن وكەم نووسین بەناو بانگ بووه، ئەگەرچی خاوەن چەند چامەیەكی كەمه بەڵام دەنگو سەدایەكی تایبەتی هەیه و بەنوێنەری ئەو وەچه نوێگەرییەی عێراق دادەنرێت كه دوا به دووای سەیاب وبەیاتی دێن ..

## ١-(([illegible]))

...ئەوە کێ یە ..
بەسەر  کوێرە ڕێگاکاندا
لەپشـــت هەنگاوەکانمانەوە ،دزە دەکات..؟
**          **          **
کەشــــــەو  دادێ
کێ .لـــەپەنجەرەکانمان  دەدات ..؟ .و
کە .بـــا. ش هەڵدەکات
چمکـــــی پەردەکانمان دەلەرێنێتەوە ..؟
**          **          **
کـــێ لە خەونەکانماندا  ، دەستەکانی دەکاتەوە.و
بەدرێژایــــــــی ڕووبار بانگمان دەکات
کە بپەڕینەوە  بۆ ئەوبەر
**          **          **
کـــێ لەگەڵماندا  هەناســە دەدات ..؟
کێ لە دوا ڕادەی  بێ دەنگیدا،
بە چپــە شتێك  دەڵێ ..؟
**          **          **
کـــــێ لەقووڵترین  ســــــاتەکانی بێدەنگیدا
لە ئاوێنەدا، بــزە دەیگرێ ..؟
مــــــــــردووان .....

## ٢-((خـــــــەونی شێری ئاگر))

....شێرەکان
لـەو دیو شیشەکانەوە، نیگەرانن ..و
ئەو دەمانەش تەماشا کەران ،دەردەکەون،
درژ دادێن .
بە بێزارییەوە، لەژوورەکانیاندا
گــرمۆڵە دەبن .و
ڕادەکشــــــێن..
خــــــەون بە وولاتان ..و
دەشتی فراوان ..و
مـــــاشێری تۆڕەوە دەبینن .و
بێچووە شێری قۆشـمە
کە یاری بەکلکیان بکا و
بەسەر فەرووە ئاڵتوونینەکەیاندا بخلیســـــــکێ
....و ...ئەو کاتانەش
کە گرتکە گۆشـــــــــتیان، دەخرێتە پێش
شـــێرەکان،ئەو لەززەتە بیرچووەیان /بیر دەکەوێتەوە
لـــــــەززەتی پەلامـاردان ....!

## ٥ - ((میرۆسلاڤ هۆلۆب))

...ساڵی (١٩٢٣) لەدایك بووە ،هەروەکو چۆن بەشاعیرێکی پایە بەرز ناسراوە ئاواش بەدکتۆرێکی باسۆلۆجی لێزان ناسراوە لە بوارەکەی خۆیدا، خۆی دەڵێ ((جیاوازیەکی قووڵ نیە لەنێوان عەقڵی زانستی و عەقڵی هونەریدا، چونکە هەردووکیان لوتکەی داهێنان و سەربەستین ئەگەرچی زانست بیردۆزی وئەزموونیشە بەڵام هونەر تەنیا ئەزموونییە و دەڵێ : ((من حەز دەکەم بۆ ئەوانە بنووسم کە شیعر یان مەبەست نیە .

نموونەش بۆ ئەوە من حەز دەکەم بۆ ئەوانە بنووسم کەهەر ناشزانن کە من بۆ ئەوان دەنووسم، حەزدەکەم ئەوانە بە شێوەیەکی سروشتی چامەکانم بخوێننەوە هەربەهەمان شێوە کە ڕۆژنامە دەخوێننەوە یان وەکو چۆن دەڕۆن بۆ سەیرکردنی یاریەکی تۆپی پێ ، نامەوێ بە شتێکی لەوە گرانتری ببینن یان شتێك بێت شایەنی پیا هەڵدان بێت .

## ((دنیــــــا))

..بــڕۆ..و .دەرگاکە بکەرەوە
ڕەنگە لە دەرەوە،دارێك
یان دارستانێك،
یان باخچەیەك،
یان شـــارێکی ئەفسووناوی هەبێت ..
بڕۆ و دەرگاکە بکەرەوە
ڕەنگە ســــەگێك بگەڕێ .
ڕەنگە  ڕوومـەتێك
یـان چاوێك
یان وێنەیەك ،
وێـــــنەیەك /ببینی..
بڕۆ .و.دەرگاکە  بکەرەوە
ئەگەر تـەم ومژێکیش هەبێت
ئـەوا دەڕەوێتەوە .
بڕۆ .و.دەرگاکە بکـەرەوە
ئەگەر هەر هیچیش نەبوو
جگە لەتاریکیی
ئەگەر هەر هیچیش نەبوو

جگە لە.بـــا.یەکی ووشــــــك
ئەگەر هەر هیچیش نەبوو
بڕۆ دەرگاکە بکەرەوە
لانــــــی کەم / شـــــــــــــنەیەك دەبێت..

## (( نەرنان ن لە نەن، تۆزێ ننن نان ن [illegible] نرۆڤانەتندا ))

.... پارچەیەك، لـە جیهان دێنن و
دەیخەنە مەنجەڵێکەوە
گـــــەرمی دەکەنەوە
دەیکوڵێنن
بە
تــــا دەکوڵێت
گوێ لە دەنگی ، کوڵانەکەی  دەگرن
بە درێژایی ژیانیان
چاوەڕووانی، گرتکە گۆشتی کوڵاو دەکەن .
بەڵام لەژێر ئەو ســــــەرقاپەدا ،
چـــــەند هاوکێشـــەیەك هەیە
وەکو :
بـــــەفر ..و.پشکۆ...

## ((شەئاز بەشەئائە ئاندا))

..ئـەوان .بۆ
باڵندەکان، ستران دەچڕن و
مـــاڵەکان، گـەورە دەبن
تۆزێ لــە خشتی کلێساکە بەردەبێتەوە
لێرەو لەوێ
پەڕێك،
یان پشیلـــــەیەك
یان سەگێك ، لەئاسمان بەردەبێتەوە ..
ئەوان ، ستران
بــۆ باڵندە، دەچڕن
ماڵەکان، گەورە دەبن ..و
لەدیوارەکانیدا،
خوێنێکـی ڕاستەقینەی ســـــــپی ، دەڕژێ !
لە هەناسەدانی ملیۆنەها کەســـدا،
مانگ، هەڵدێ و
دڵـە فراوانەکانیش ،
شـەو بەرەو ڕۆژ گلۆر دەکەنەوە .

هێندەمان بەسە
کە زیندووین و هەناسە دەدەین
ئێمە لە ســــــووڕانەوەی ، زەمین
بەر پرسین ..!

## ((پشـــــــــــــیلە))

... شـــــــەو ،
لەدەرەوە ، وەك پەڕاوێکی بێ پیت ..و
تاریکی یەکی بێ کۆتاییش
لەبێژنگی شـــــــــارەوە دەڕژایە ئەستێرەکانەوە .
پێم ووت : نـــــەڕۆی
بۆچی هیچ شتێکت ناوێ...؟
بـەڵام پەنجەرەکە کرایەوە و
ڕۆشـــــــــــت.
پشیلەیەکـی ڕەش ،
لـە شـەوێکی ڕەشــدا ، لەبەر چاو وون بوو
پشیلەیەکی ڕەش ،
لە شــەوێکی ڕەشـدا ،
لەبەر چاو وون بوو ..هەر هێندە ..و
ئیتر هەرگیز هیچ کەسێ نەیبینیەوە
هیچ کەس ، تەنانەت خۆیشی
بەڵام...
هەندێ جار
ئەو دەمانەی ،

دنیا  بێ دەنگ دادێ و
بایەك لەباكوورەوە هەڵدەكات
تۆ بە ووردی گوێ لـــە زاتی خۆت دەگری ..
دەتوانی ، گوێت لێ بێت . . .

## ((ئـــــــا ئائه ئ ئ ســــــه ئز))

....پەیکەری پاڵەوانەکانمان
ڕزیــن .و. بوون بـەبەرد
ئەوەش
دوا کارەســـــاتی، دوا جـەنگە
ئاسمان
بەسەر ئەو جێگایەدا ،
پاشـــماوەی ،برینێك تیمار دەکا
ڤیژەی ڤازەکانیش
بانگ له بریندارەکان دەکەن
کـه ســـەر لەنوێ ژیان ببوژێننەوە
بەڵام لـەژێر زەویدا
مشکێك کە خەریکە بزێ
بـــــەوی تر دەڵێ:
لـــەوێ نا ،وەرە نۆزێ دوور تر بکەوە ..

## ((ئەحمـــــــــــود دەرویش))

## شـــــــاعیری بەناوبانگی فەلەستین

### ١-((نووشـــــــــتانەوەی بازنە ))

★ / بنووشتێوە ، خۆشەویستم ،
تـا ڕەشەبا تێپەڕ دەبێ .
-/ هێندە پشتم نووشـــتاندەوە تا بوو بە کـەوان
کەی تیرەکەت دەوەشێنی ..؟
(..دەست بۆ دەستت درێژ دەکەی ،
هەر مشـــتێ ئارد دەدۆزیەوە ..)
★ ★ ★

★ / بنووشتێوە ، خۆشەویستم ،
تـا ڕەشەبا تێپەڕ دەبێ .
-/ هێندە پشتم نووشـــتاندەوە تا بوو بەپرد
کـەی بەسەریا ،تێپەڕ دەبی ..؟
(.. هەوڵ دەدەی پێت ببزوێنی ،

بەڵام ئاســن نابزوێ ..)

* * *

* / بنووشتێوه ، خۆشەویستم ،
تـا ڕەشەبا تێپەڕ دەبـێ .
-/ هێندە پشتم نووشــــتاندەوە تا بوو بە،
نیشانەی پرسیار ،ئەی کەی وەڵام ئەدەیتەوە ..؟
(..دادگەر كاسێتێك لێ دەدات ،چەپڵەیێ زۆری لە سەرە
کە ڕەشەبا پرش و بڵاوی كردنەوە ، ئێستا بەسەر داهاتوودا
دەیقیژاند ؛ تۆ هۆكار بوویت .
ڕابوردویش تاوانەكەی دەكرد بە یاسـا .بەڵام ،
ئاینده ،گەواهێکـی بێلایەن بوو .کە ڕەشەبا کە /
نیشـتەوە، نووشتانەوە، تەواو بوو بوو بوو بوو بە بازنەیەك،
سەرەتا و كۆتایی لێك جیا نەدەكرانەوە ..!!

## ٢-((ئـــا ئازاڵ ئـــ ئ ئەرئجانه ))

.....شـەقامێکی ڕوون..و
کـچێك
هاتەدەر ێ ،مانگ ..و
ووڵاتـە بێ پاشـــــماوەکان بســووتێنێ
٭ ٭ ٭
خـەونێکی ســوێر .و
دەنگێك
کـەمەر لەســەر بەرد هەڵدەکەنێ..و
خۆشەویستم
بەســـــەر برژانگمدا ،
یـــان بەسەر ژێ دا بـــــڕۆ ...
٭ ٭ ٭
مـانگێکی بریندار و
بێ دەنگیی
(با)و (باران ) دەشکێنێ
ڕووبار دەکاتە دەرزیەك
له دەستێکدا  دار دەچنێ
دیوارێکی خۆشتوو ..و

کچێك

هـەرکاتێ دەرکەوت ،وون دەبێ

ڕەنگە بمانکوژن

یان لە ڕاڕەودا دەنوون.

★ ★ ★

لە ڕووبار نزیك بووینەوە

گەشـــــتی قەرەجان تەواو بوو .

ماندوو بووین لە ســـــەفەر .

★ ★ ★

شـــەقامێکی ڕوون .و

کچێك

هـاتە دەر

وێنە لە ســەر دیوارەکانی تەرمەکەم .و

خێوەتـــە دوورەکان .و

خێوەتـــەبێ پاشماوەکان ،هەڵواســـێ

★ ★ ★

زەمەنێکی بێ ئابڕوو..و

مـــەرگێك

کە تێپەڕی ،ئارەزوومان دەکات ..و

ئێســـــتا هەموو شتێك تەواو بـــوو ....

## (( ئوئاد ڕئقه ))

## ((نەخشـــــــــە))

..لـەجێگایەکدا ، لەم چرکەیەدا
بەیانیە و
چەند هەنگاوێك ،هەڵدەهێنرێن
لـەجێگایەکدا ، لەم چرکەیەدا
نیوەڕۆیە و
بازاڕگـەلێك ، بەفیڕۆ دەچن
لـەجێگایەکدا ، لـەم چرکەیەدا
ئێوارەیە و
کۆمەڵێك زەنگ لێ دەدرێن
خوان .و. مۆم
لـەجێگایەکدا ، لەم چرکەیەدا
ئەســـــتێرەیەك ،دەکەوێ
گـەلەگورگێ ،دەلوورێنن
لـەجێگایەکدا ، لەم چرکـەیەدا
کەسانێکی وون بوو لــەدەرگا دەدەن

چـــرا گەلێك دەكوژێنەوە .
لەجێگایەكدا ،لـەم چركەیەدا
عاشـــــــــق گەلێك ئەڤین دەچێنن
گوڵ بەدیاری ، دەنێرن
لەجێگایەكدا ، لەم چركەیەدا
لـــەدایك بوونێك ، دەمرێ
كۆتاییـــــــــەك ،لەدایك دەبێ .
لـەجێگایەكدا ، لەم چركەیەدا
چارەنووس گەلێك، نەخشە دەكێشن ،
هێـــــڵی ڕێگاوبان
دەكێشـــــــــــن..!

## (( ڵـــــۆزڕ ))

..لــەلایەکی دارســـتانەکەدا ،گۆزەیەك هەیە
لــەبەهاردا ، گڕ دەگرێ
لــە هاوین دا ، دەبریســـــكێتەوە
لــە پایزدا دەتوورشێ
لــە زستاندا .. هەڵدەلەرزێ
ڕێگایەکی بــۆ ناڕوا
بـەتەنیا خۆیەتی
هەمیشە بەتەنیا لـەسەر کەناری هەڵدێرە
پێلووەکانی هەناسە بڕکێی ناخــن
......خـــانمە شـــــاعیرێکە .....

**((پەلك))**

.....تۆوێك ، لەدەستی ئاسمان بەردەبێتەوە
لـەشێی بێ دەنگی دا، شـــــەق دەبا
پێلووەكانی بۆ هەوا هەڵدەخا ..و
لـەوەرزی دروێنـەدا ،
گوڵێك ، دەبێتە
پـــــەلك بۆ ژنێك ......

## (( ئەزنشە ))

.... کەپیکەوەن
کێوی  بێدەنگیان ،لەنێواندایە
کە دوورن  :
گڕی یادگاری یان لەنێواندایە .
هەمیشـــــــە .ئەو .(ژن)..ڕووگایە ..
هەمیشـــــــە   .ئەو (پیاو)..ڕێگایە...

## ((بـ ژ نەردژ ژ))

..یادی دەکاتەوە و
بەندەرەکانی ،نێوانیان
دەردەکەوێ ..و
فرمێســکەکانی دەسڕێ ..!

(( ئشـــتێ ئاز ئوێ ئاباز ژ ))

< تووانەوەی بەفر >

# شاعیرێکی بێ ناونیشان #

.....گەر شەوانی بێ تۆیی ،
وەك بەفری باریو
بە سەرمدا ، بکەوێ
ئای خۆزگە ، لە گەڵیا وون بوومایە ..
کـە دەتووایەوە ..!

(*****)

< باشۆ (١٦٤٤/١٦٩٤) >

..... نەوت
لەچـــراکەم دا نەما ، نووستم
شـــــــەوێ ،
مانگ لە پەنجەرەوە ، هاتەژوورەوە ...

( ★ ★ ★ ★ ★ )

< باشۆ (١٦٤٤/١٦٩٤ >

...ئێوارەیەکی پایز
قەلەڕەشێك
لەسەر چڵێکی مردوو ڕۆنیشت

( ★ ★ ★ ★ ★ )

< باشۆ (١٦٤٤/١٦٩٤ >

.......ئاوەکە زۆر ســـــــاردە
نەورەسەکە ،نەیتووانی
تیا بنوێ ..!

( ★ ★ ★ ★ ★ )

...بەخێر بێت ، بەهار
بولبولەکان ،لەباخچەکەم دا ،
بە تیشــکی ڕۆژ خۆیان دەشۆن ..!

( ★ ★ ★ ★ ★ )

> شـــــیکی <

..ئالەم جیهانە فانیەدا
داهۆڵیش ،
لەشـێوەی مرۆڤ دایە ..!

( ★ ★ ★ ★ ★ )

...لەسەر لووتکەی کێوەکە
من و شاعیرێکی تر
هاوڕێی ،میوانێکی مانگی هاوینین ..!

( **پیرۆ ز** )

- قەرالیچە (awata  لە(٧٦٤)ـدا مردووە .

.. بەهاران ،
ئەو دەمەی ،هەزاران چۆلەکە
ستران دەچڕن
هەموو شتێك تازە دەبێتەوە ،
بەتەنیا من پیر دەبم ..!

## ئاشـــــــــــــــ ژ )

(narebera ) کوڕەزای ئیمبراتۆر

.....مانگ ..؟ وەکو خۆی ....نەماوە
بەهار .؟ ئەوەی ڕۆشت ,بەهار نەبوو
بەتەنیا ،
من ، ناگۆڕێم ..!

( * * * * * )

...... لەباخچەی زستان دا .
مشـــــکێکی وون بوو
یاریی دەکات ...!

( ★ ★ ★ ★ ★ )

Oral( ١٦٥١-١٧٠٤)

......ئالەم بەیانی بەفرەدا

جگـە لەکۆچەران

کەس  بەسەر  ، ڕێگاکەدا ،

تێ ناپەڕێ  ..!

## ((ئوجین ژنا ئك))

.. له ولایەتی کارناك (فەرەنسا )لەدایك بووە، سالێی(١٩٠٧)ولەتەمەنی دووازدە سالێدا دەستی بە نووسینی شیعر کردووە، بەلاّم تا تەمەنی سی سالّی هیچی بلاّو نەکردەوە ، ئەو کاتەی کە چاپخانەیەکی بچکۆلّە کتێبێکی بچکۆلّەیان بۆ چاپ کرد بەناونیشانی (قداس)پاش ئەوەی کە دەزگای گالیمار کۆمەلّە شیعرێکیان بۆ بەچاپ گەیاند سالّی (١٩٢٠)پێشوازیەکی شیاویان لە شیعرەکانی کرد..دریۆ لاروشیل لەنووسینێکیدا بە( دۆزینەوەی ) ناو بردبوو لەو کاتەوە گیلفك زیاتر لەبیست کتێبی بە چاپ گەیاندووە ..

## ١-( گوز زز گـــو ڵگو..)

..گـــــوڵ ،
وەکو لێـــــــو ،
وەکو جەســـــتە
گـــوڵ ،
زیــــــــاتر لـەگوڵ
گـــوڵ ،
وەکو دەروازەیــەك
بــۆ ئەو جەســتەیەی ،
کـەوا دەســــتی لێ وەردەدەم .
بەتەنیشــــــتتەوە
تێ دەگەم ،کە لێو چی یەو
چیش وا لە جەســـــتە بکات ،
کــە جەستە بێت ..

## ٢-(بادووبارەی بکەینەوە)

...........با دووبارەی بکەینەوە :
زەمین هی مێروولەشە .
ئێمــە ســـەرسـامین بە ڕووناکیی و
پێویستیمان بە خۆرە .
بــا دووبارەی بکەینەوە ،
خــــاك لەویٚ یە و
چاوەڕووانی سبەینیٚ ناكات .
هەموو   ڕۆژێك ،ئەركی خۆی هەیە و
فراوانترە  لـەو زەمانەی ، كەتەنیا یەك ڕۆژ نەبێت /
هیچمان پیٚ نابەخشـــیٚ .
بادووبارەی  بکەینەوە
ئەم گۆشــەی زەمینە ،
زۆر پێویســــــــتی پێمانە ..!

## ((سەلاح سـتێتە ))

.. ئێستا، مۆسیقا ژەنەکان ، لەدووریدا بڵاوەی لێ دەکەن
پێش ئەوەی بنوی ،
دەبێ غاربدەین ،دەبێ دەست لەکراسەکانیان
وەربدەین .
هاوار هەمووی لە دەرەوەیە و ئاویش بە کاروانێکی شـل/
دەرژێ..
ســـــەرێکی تر ،
هێرش دەکاتە ســــەر ، سـەرێکی تر
هەردوو کوونە لووتی ئەسپ زەریاچەیەك ، دادەخەن
خشـۆکەیەك، ڕســـتەیەکی، درێژ.. درێژ، دەنووسێت
بـــووکی زەریا
پـــڕلەبەروبوومی لم ..
ڤیژەیەکی تر، بەشەبقەیەکەوە، تا لووتی شـاخ دەڕووا تـو
دەکــــەوێت .
خوداوەندێکی تـــــەڕ ..و
قەڵغانەکانی/ بەچڵ دا هەڵدەواسن .
تا دەمارە زیندووەکانی سـەردەکەوتم .

له ڕووبه‌ڕوو بوونه‌وه‌ی كێڵگه‌یه‌كی گوڵ دا
شمشێری بێ ده‌نگیم هه‌ڵكێشابوو
له‌نێوان هه‌مووان دا ،خۆشه‌ویست و
.شمشێریش زیاتر دڵنیا
باسكه دره‌وشاوه كه‌ی ده‌بووه جیهانێك و
دوورابیش ده‌كه‌وته ژێرمه‌وه
وه‌لێ /من چاوم بڕیبووه /كاتژمێر و ده‌رزی
تا بیشكێنم و به‌شكاوی بیگه‌ڕێنمه‌وه
ئای.. نان له‌دادپه‌روه‌ریدا /بخۆم
من له نان زیاترم ده‌ویست ..
ووتی :مێش و مه‌گه‌ز و به‌درێژایی به‌رده‌وام
.......................و ڕه‌ش ولاواز /
له‌كێڵگه‌یه‌كی سێبه‌ری ئاماده‌دا
هـــه‌وا له‌گه‌ڵ مێش ومه‌گه‌زدا ، ڕۆشت ..
ســـه‌رمایه‌یه‌ك مایه‌وه :سپی به‌جووتێ مه‌مكۆڵه‌وه .
لم به‌هێزه‌و ..خـودا .له‌ده‌ره‌وه
به‌سه‌ر مێرگه تۆخه‌كاندا ،ده‌سوڕێته‌وه
لێـــــره ، له‌هه‌ڵكه‌ندندا
قۆڵــه فراوانه‌كه‌ی جێهێڵا ...
قۆڵی هه‌ڵكه‌نێنه‌ری خـودا ،چ بكه‌ین ،یان بڵێین ،،؟
قســـه خوێن له ده‌ماری پیاوان دا بریندار ده‌كات ..

ئەوانەی لە بریسکەی دیوار دەرهاتوون.. شتێك لە دەرەوە
ئیزیس ڕاوەستاوە .و گوێچکەکانی ڕەشن
لەنێو دەرگا زەخرەفەکاندا ، چاوەڕووانە
بەشــــــپرزەیی دێتە ژوورەوە .و.ســـڵاو-
لە ئەستێرەی بەردین دەکەین وئەوی تریش لە شوێنە قەترانیەکان دا
-ئەمەو تاجە گوڵینەکان لە ژاوە ژاوێکی جەرگبڕدان
ژن ومێردەکە وون بوون _ژنەکە
بریقەی بزن لە نێو مەمکۆڵەکانیدا بوو
-لەداوەتی شــــــەراب دا گرتمان .
ئەوســــــا لەو پەنجانە ڕووی دا کە مســـیان کۆدەکردەوە ..و
داگیرکردنی ئاشـکرا لەلێواری ئەم ڕێگا ئاخاوتنەی/ کەنابینرێت ..و
ئاگریش دەســـتی گرتبووە ،ئەو تەمەی کە لەئاورینگەوە دەرهاتبوو ..
کـەواتە بلـوور ، ڕەنگە ئەمەی ووتبێ
..............................................
حەشاماتگەلێ لـەژێر دیوارگەلێکی
گـەرم وڕەش دا ،بەکاروانی ،کۆکـراوەیی دەڕۆن..
دەستەکان /پەنجەکانی شێت دەکەن

/به ئاراستەی تەنی تر :لـەهەوادا ،یان .دێو .و درنـج .
*ئاوێنــە*_هەڵکەندن
پڕکێشی کردن _خۆ ئامادەکردن
له پارچەی باڵندەیەکدا _بێ دەنگیی

دووجار بەسەر هێڵێکدا هەڵدراوەتەوە ،لەدوورەوە
ئەی ســـــەری ،
بـەبێ گوێ پێدان پارێزراو _گوێ بگرە لــەهونەری
گژ وگیا .
لـەگەڵ ئەوەشـدا :
ئەو دارەی ،یەخســــیری هاوکێشەیەکە /دەڤیژێنێ.
هـــــاتنە ژوورەوە ،خوانەکە هەڕەشە لێکراو .و لق و
پۆپی لێ دەبۆوە..
هیــــچ کەس . ناوەوەیان له هەوادابوو
ڕۆح . گرێکە بەســــــــــــەر ئاوەوە
باوێـشـــــــــك ئەدا ...!!!

## ((ئبرا ئم ئـــازۆ))

## (( ئر ئائ ))

...چی دەبوو
گەر..
ئەوەی کە لەسەرمدایە ،
ڕووی دابایە .
گەر ..
بەیانیانێك
هـەموو شـــا عیرەکان
بە هێمنی
بەرەو ،ڕووگای /
زەریـــــا چوونایە..
گەر..
ئـەم ئاســمانە
هەمـوو بۆشاییە کانی
لە جانتایەکی جوان خســتبایە..و
وون بایــــــە ..

گــەر..
شـــــەو..
دواجگەرەی ..
پێش یەكی بەیانی
بكێشـــــــایە ..
گەر..
زەمین
زەوقی  بچووكی تێكچووبایە ..و
نەچووبایە ..
بــۆ جێ ژووان ...
چی دەبوو :
گەر ئەوانە  ڕوویاندابایە ..و
ئەم ژیانە بەتەنیا خــۆی
بــەڕووتیی ،
بمایایەتەوە.....!!

## ((..ليۆن فيليب..))

ساڵی (١٨٨٤ )لە یەکێك لە گوندە ووشکەکانی پارێزگای سامۆر لەدایك بووە ،ناوەندی لە فلادۆلیس تەواو کردووە باوکی دادنووس بووە حەزی کردووە کوڕەکەی بچێتە زانکۆ ، لیۆن بەشی دەر مانخانەی تەواو کردووە چونکە ئەم پیشەیەی خۆش ویستووە، ساڵی(١٩٢٩)بەشی دووەم لە (چامە و نوێژەکانی موسافیرێك ) بلاْوکردەوەو کە بەشی یەکەمی ساڵی(١٩٢٠) لە مەدرید بلاْو بووەوە وهەرایەکی نایەوە چونکە ئەم دیوانە بەتەواوی ڕەنگدانەوەی کارەکانی والت ویتمانی تیا دەردەکەوت کە بەبرای ڕوحی لیۆن فیلیب دەزانرا .

لیۆن زۆر وولاْت گەڕا شیعری دەخوێندەوەو ئامادە دەبوو . لیۆن ساڵی (١٩٦٨ )لە تاراوگە مرد ،شیعرێکی سادەو بەهێزی جێهێلاْ ..

## (( ڕڕ ڵو تۆ ))

......ئاوەهایە ژیانی ،من
بــەردێکە ،وەکو تـــۆ
بـــــەردێکی ،
بچکۆلــە .وەکو تۆ
بــــەردێکی ،
نـــاسك .. وەکو تۆ
ووردەچەوەو بەسەر ڕچەو ڕێگاکاندا
گلۆر دەبنەوە ..وەکو تۆ
وورده چەوی نەوازش لەڕێگاوباناندا
وەکو تۆ
لــەڕۆژانی زریاندا
لە قوڕاودا،نوقم دەبێ ..و
پاشــان لە ژێر سم وتایەدا ،دەبریسکێتەوە
وەکو تــۆ
کەبەکەڵکی ئەوە نایەیت / بەردێك بیت بۆ کۆگایەك
بــۆ کۆشکێك ،بۆ دانیشگەیەك ، بۆ کلیسایەك
وەکو تــۆ
بەردێکی سەرکێش و بزێو

وەکو تــۆ
دروست بووی ، تا /لەدارلاستیکی منالێکی بچکۆلەدا
بـــەردێك بیت .. وهیچی تـر...

## ((..سان ژۆن پێرس ..))

### _دانبڕن ئە لــە چانەی ..ئاناپاز..

.....وامن ئەســپەکەم لەژێر دارە پڕ لە کۆترەکەدا ،ڕاوەســــــتاند
فیکەیەکی بێ گەرد دەکێشم ،کەهیچ بەڵێنێکی بڕاوە
لــەم هەموو ڕووبارانەوە ،نەدا بەکەنارەکانیان .
(( لـەبەیانیاندا ،گەڵای زیندوو لەشێوەی شکۆدایە.))

★

ئەوەش ئەوەناگەیەنێ کە کەسیان دڵتەنگ نەبوون
بەڵام ئەو پێش بەیان لەخەو هەستاو ،بەترسەوە لەپەنای /
دارە کۆنەکەدا ڕاوەســتا .و بەرپشی،ئانیشکی دادایەسەر
دوا ئەستێرە /چونکە ئەو لەقووڵایی ئاسمانە —
هەڵدراوەکەدا شتی گەورە و بێ گەردی چاو دەکرد-
دەبــوونە لەززەت ..

★

هەرکە ئەسپەکەم لەژێر دارە پەل و پۆ درێژەکەدا
ڕاوەستاند
فیکەیەکی بێگەردتر دەکێشم‌و سڵاو ((گەر دەمرن))
لەوانەی ،
کە ئەمرۆیان نەبینی ،بەڵام هەندێ هەواڵمان
لەبرا شاعیرەکەمەوە
پێ گەیشتووە کە هەندێ شتی تری زۆر ناسکی
نووسیووە.و
هـــــەندێکیان پێیان زانیوە....

★

## ( عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی )

### ( شتی ئەشبیلە )

...
..لەژێر ژێرالدادا
جوانترین ،پیاوی سەر زەمین ،دەمرێت.
..لەژێر ژێرالدادا
دوا خۆشەویستی  سەر ڕووی ،دەمرێت
..لەژێر ژێرالدادا
شـــــــێتانە ،دەقیژێنم .و.دەمرم..!

٭

## ( پیاوێکی نەناسراو )

.....پیاوێك ، لەنێوتەپ .وتۆزی ســــــاڵەکانەوە
لەدەرگای دام
ســــــــڵاوی لێکردم و ،پێم ووت: بەخێر بێی)
بەڵام پیاوە نەناســـــراوەکە
لەپێش دەرگاکەمدا :مرد...

★

## (ڤئ د ئتئ ئۆلائ))

..یەکێکە لەو شاعیرانەی کە تا مردن هەموو ژیانیان بەخشیوە بەشیعر ، ساڵی (١٩٨٠)مردووە پاش ئەوەی سێ هەزار لاپەڕەی چاپ کراوی شیعری بۆ بەجێ هێشتووین ،پێش جەنگی جیهانی نووسینەکانی بە دژایەتی کردنی فاشیەت بارگاوی بوو ،تەنانەت چەند چامەیەکیشی کە پاش جەنگ نووسیبووی وەکو (مایسی /١٩٤٥)، (سیانیان)سەربازی رووسیان بە پاڵەوانێکی ئەفسووناوی دەشوبهاند، بەڵام ئەو هەوڵ وماندوو بوونەی هیچ سوودێکیان پێ نەبەخشی وپشت گوێ یان خست وساڵی (١٩٤٨)شاعیریان بە شکلیەکی مۆمیا کراو تاوان بارکرد و بەڕەسمیش بەرهەمەکانی چاپ نەدەکرا ...

پێش وەخت خانەنشین کراوخۆی ژنەکەی و کچەکەی دوورکەوتنەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی ،گۆشەگیری ونەداری و گوێ نەدان ......

ساڵی (١٩٦٤)رێزو حورمەتی خۆی بۆ گەڕایەوە ئەو کاتەی خەڵاتی یەکێتی نووسەرانی بەلجیکیای پێ

بەخشراو ساڵی (١٩٦٨)خەڵاتی بەرزی نیشتمانەکەی پێ بەخشرا .

هۆلان یەکێکە لەو شاعیرانەی کە ڕۆژانە شیعر دەنووسێ تا وای لێهاتووە شیعرەکانی نزیکن لە تۆماری ژیانی دەربارەی ژیانی فکری و سۆزداری خۆی .

## ..پەیام..

.....تۆ دەمریت ..ئایا ژیانت خۆش گوزەراند ..؟
-بــەڵێ
چــۆن ..؟
جارێکیان لەسایەی ،کۆنە دارێکدا /
کچێکی نەناســـراو نامەیەکی دامێ ..و
تێپەڕی ..
ئایا خوێندتەوە ..؟
بـــــەڵێ.
چـــــی دەگوت ..؟
هیــــــــــچ....!!

★

## (( ئای ئواز ژ ))

(١٧) ئازاری ساڵی ١٩١٠له دایك بووه ،ئەو ساڵەش دواساڵی ئیمارەتی کۆنگە، ئەو ساڵەیەکە پێش شۆڕشی ١٩١٠ بزووتنەوەی ٤ ی مایس١٩١٩ هەڵگیرسا ئەو دەمە ئەو خوێندکاری سەرەتایی بوو . بە گەنجی حەزی لە ڕەسم کردووە. ساڵی (١٩٢٦)بەشی نیگارکێشانی پەیمانگای زەریای هونەرە جوانەکانی خۆرئاوایی لە هانگشۆ وەردەگرێ ،پاش کۆرسی یەکەم بەڕێوەبەری پەیمانگەکە دوای ئەوەی وێنەکانی دەبینێ پێی دەڵێ : (لێرە هیچ فێر نابیت چاکتر وایە سەفەر بکەیت بۆ دەرەوە )پاش ئەوە چوو بۆ پاریس ساڵی (١٩٤٥)دەڕوات بۆ ئەمەریکا .

ساڵانی (٣٢-٣٦) یەکەم هەڵبژاردەی شیعری بە ناونیشانی( دیانا)لەسەر حیسابی خۆی چاپ دەکا، هاوڕێیەتی لەگەڵ شیللی ونیرۆداو جۆرج ئەمادۆدا هەبووە .

(( ئای ئەی چین
ئایا دەکرێ لە شەوێکی بێ چــــــرادا
ئەم دێڕە لاوازانەم هەندێ گەرماییت پێ ببەخشێ ..؟))

## -ژژڵاژ ژ خەڵوز

..-/   لەکوێ دەژیت ..؟

*/  لە دە هەزار کێوێکی بەرزەوە ..

*/  لە دە هەزار ساڵی ڕاماڵینی بەردینەوە ..

-/  ئەی تەمەنت  چەندە ..؟

*/  لەتەمەنی چیاکە گەورەتر .

*/  لەڕاماڵینی بەردین بەتەمەن تر ..

-/   لەکەیەوە بێ دەنگیت ..؟

*/  لە فەرمانڕەوایی دەیناسـۆرە دەشتیەکانەوە ..

*/   لەو  کاتەوە  کە  زەمین   هەستی  بەیەکەمین هەڵلەرزین کرد ..

-/  مردووی ..؟

*/  نەخێر..نەخێر ..من هێشـتا زیندووم

تکــــایە ئاگرێکم بـدەیێ

لێم گەڕێ با دەست لە ئاگر وەربدەم ..

## (( ئونسئلحاج ))

..یەکێکە له سەرکێش ترین شاعیرانی گۆڤاری شیعری لوبنانی .

هەندێك له بەرهەمەکانی :

١/لن

٢/الرسولة بشعرها الطويلة حتى الينابيع .

٣/الكلمات الكلمات الكلمات .

٤/الخواتم

..هەموو خۆشەویستی‌یەك دەست بەسەر داگرتنە و
هەموو جوانی یەكیش ،
لادانـەكانمان دەشـــــارێتەوە .
هۆی هەرە گەورەی ڕق لێ بوونم ،لە جیهان ،ئەوەیە
كە نەیهێشتووە /جگــە لە
خۆشەویستی هیچ شتێك بكەم لە ژیانمدا ..

* * *

جـــــــوانترین ،شـــت كە دەمان وورووژێنێ
،لـەجوانیدا. . .فرمێســـــكە..!

* * *

ئەو چركەیەی كە لەبەرامبەر -شـەنگیدا-تیا
دەگرین، دانپیا نانێكە كە
هەموو ژیـــانی ڕابووردومان بیابان بووە. . .

* * *

جوانیی بەوە دەســت پێدەكات ،كە بمانگرێنێ،
لەسەرسامیدا ..و بەوەش كۆتایی پێ دێت كە
بمانگرێنێ ،لە حەسرەت بۆشایی هـزرمان
پێش ناسینی ،ئەو..

* * *

.((هـــەرکاتێك خۆشم ویستن لە شەمەندەفەر،
کەوتم ..))
((هـــەر کاتێك خۆشم ویستن لە شەمەندەفەر،
کەوتم..))
-ئایا وا دەزانیت ،ڕۆژێ لەڕۆژان کەسێکت خۆش
ویستووە
کە پێویست بووە خۆشت بویســـــــتایە..؟

-بێگومان ..ئەوەی کە ((پێویستە))خۆشم
بوێ..پێویستی ئازارە
بۆ ئەوەی کە دەبێ دژبەخۆی بژێ..

* * *

...کەس نرخی جەستەی کچۆڵەیەکی نازدار نازانێ/
عاشـــــقێکی پیر نەبێت
وێنەیەکی تر لەحەتمیەتی هەڵە ،لەهەموو ئەندامی
پەیوەندیە
مرۆییـــــەکان دا.

* * *

هەیـــــــە دەمرێت ، بەو هیوایەی  پاش مردنی

بگات بەوەی

بیری دەکات ..

* * *

باشـترینمان ،زۆر جار ئەوانەن کەنازانن/

لەکەســــــی تر باشـــــترن...!

## (لە ئەستەنبۆڵەوە)

## (شـــــەوێك)

...من لەگەڕەكە تاریکەکانی جیهان دا ، دەژیم
ئەو گەڕەکانەی ،
کەبێ ڕووناکیی و تەنانەت بێ ژیانیشن
هێندە تامەزرۆی ژیانم
کە بە شەقامەکان دا ، دەڕۆم
نووساوم بە ڕێگاکەمەوە
بەرەو ئەو خەونانەی
کە شێوەیەکیان نییەو
پێم لەکۆتەکانی ،بەندایەتیم، هەڵدەنووتێ ،
********

گەڕەکەکان تاریکن
جیهانێکن لە نەگبەتی
کە ئیرادەی تیا وشك دەبێتەوە و
پیاوان تێکەڵ بەشتەکان دەبن

وا من بە گەڕەکە تاریکەکان دا ،
بە دزیەوە ، دەسووڕێمەوە ،لەتر دەبەم
ئەو دەمانەی  کە ترس و نامۆیی لەو کۆڵانانەدا
گرد دەبنەوە  و
من لە  زۆرانبازیدام ..زۆرانبازی
لەگەڵ ئەو تارماییانەدا
بەڵام شەویش  ،تاریکتر دادێ ...

## (( [illegible] ))

### ( [illegible] )

....شــوانەکان ،
ڕۆژ لە دارستانە ڕووتاوەکەدا   دەشارنەوە
ڕاوچی یەکە
بەتەڵی دڵ
مانگ لە زەریاچە ساردەکە دەردێنێ
پیاوە تۆخەکە
لەئاسمانێکی شین دا نیشتە جێ یە
بەکوڵم ئانیشکی داداوەتە سەر  ئەستێرەکانی
یان ئەو سەری لە خەوێکی سووری تۆخ دا، دەنوێنێ.
بەڵام ئەو
هەمیشە سەرسامە بە هەڵفڕینی ،
چۆلەکە ڕەشەکان .
ئەوەی کە تەنانەت
لە نوێژی گوڵەشینەکانیش ،هەر ڕادەمێنێ .و
هێمنیە نزیکەکە بیرلە کابرای لەبیرچوو  .و
لە مەلائیکە کوژراوەکان  دەکاتەوە

سەر لەنوێ بەرەی جەنگ لە شەوان دا
دەبێتە نەوجەوانێكی ڕووناك
خوشكەكە لە پایز و لە تووند وتیژیەكی ڕەشدا،
دەردەكەوێ .

★ ★ ★

## ( ئانێس ڕیتسۆس )

..ئایاری ساڵی (١٩٠٧) لەگوندی مونمواسیای یۆنان لە دایك بووە. ساڵی (١٩٢٦) دواناوەندی تەواو دەكات و دەڕوا بۆ ئەسینا ،كە سەركێشی ژیانی دەست پێدەكات كاری جیاوازو شیعر و فكر وشۆڕش . تا ساڵی (١٩٥٤) حەوت كۆمەڵە شیعر بە چاپ دەگەیەنێ.هەمان ساڵ ژن دێنێ زیاد لەجارێ نەفی دەكرێ، لویس ئەراگۆنی شاعیری فەرەنسی دەڵێ : دووجار گریاوم یەكەمیان كاتێ كە لەگەڵ ئەندریەبریتۆنداجیابووینەوەو كاتێكیش كە ڕیتسۆسم خوێندەوە)).

ساڵی (١٩٣٧) كاتێ كە (گۆرانی خوشكەكەم )ی بلاّو كردەوە پاڵماس شاعیری گەورەی یۆنان پێشەكیەكی بۆ نووسی تیا دەڵێ : (( ئێمە لا دەگرین ،تا تۆ تێپەڕیت ، ئەی شاعیر ..)) بابلۆ نیرۆداش دەڵی : جگە لە ڕیتسۆس، ڕازی نابم شیعرەكانم لەگەڵ شیعری كەس دا بەراورد بكەن ، ساڵی (١٩٧٧) خەلاّتی لینین وەردەگرێ .

# ( بـــــــازنە )

....هەمان دەنگ ، بەزبریەکی زیاترەوە و
بەدەم هەناسـە بڕکێوە ،پێی گووت ...
(لێرەوە ،دەستی پیٚ دەکەم و لێرەش دا ، کۆتاییم پیٚ دیٚ)
هەمیشە هەمان کێشە یە
زنجیرێکی بازنەیی و لە زنجیرەکەدا
نوێنێکی بەتاڵ ..یان مێزێکی ڕووت
هەمان چرا کە دوو دەست ڕووناك دەکاتەوە
بە پەرش وبڵاویی دەجووڵێتەوە
خۆیان لە دوو دەسکێشی لاسیکی
درێژ دەردێنن ..

## (( ئەشبێنی ))

..خۆی لەبیر چووبوویەوە و سەیری نەورەسێکی دەکرد
لە گەردەلوولێکی زەریایی دا ،دەفڕی ،کە نوقمی خۆر بوو
زەردەخەنەیەکی ناسك وتەنك دەم و چاوی تەنی بوو
چاوەچاوی جم وجووڵی باڵندەکە بوو
تا بەتەنیشت گوێیەوە نیشتەوە
هەروەکو کێشی گوارەیەکی گەوهەری هەبێ
سەری دانەواند
باڵندەکە ، هەڵفڕی
هێشـــــتا ، ماڵی حاکم ،بەسەر گردەکەوە ،دەسووتا ..!

## ژێدەرەکان :-

★/ئەدۆنیس :-

١/-لەچامەی :(الشهوة تتقدم على خرائط المادة) گۆڤاری.(فكر و فن) ژمارە(٤٥)

٢/-الاثار الكاملة .المجلد الاول ..ص.(٣٧٤)..(٤٥٠)

٣/-كتاب الحصار /الطبعة الاولى _١٩٨٥..ص..(٥٩-٦٠)

★ /-ئۆكتاڤیۆ باز :-

١ / -الحرية المشروطة.ترجمة /علي اليوسفـــي .دار الطبعة ص..(١٠)

٢ /-هەمان سەرچاوە لاپەڕە..(٣٦-٣٧)

★/-تێدهیوز :-

١/ -گۆڤاری (الاقلام) ژمارە(١)ی ساڵی(١٩٩٠) ص..(٦٩-٧٠)

٢/ گۆڤاری (الثقافة الاجنبية) ژمارە (٢)ی ساڵی ((١٠٠))

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی .(طراد الكبيسي).

★/-محمود البریکان :-

١/-گۆڤاری (الاقلام)ی ژماره.(٥)ی ساڵی (١٩٩٨)لاپەڕە (٤٧)

٢/-هەمان سەرچاوە ..لاپەڕە (٥٠).

★/-میرۆسلاڤ هۆلۆب :-

١/-گۆڤاری .(الاقلام)ی ژماره.(٩-١٠)ی ساڵی (١٩٩٢)،

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی :سامی مهدی .لاپەرە..( ٥٣)

٢/-هەمان سەرچاوە ..لاپەڕە .(٥٢)

٣/-هەمان سەرچاوە ..لاپەڕە .(٥٣-٥٤)

٤/-هەمان سەرچاوە ..لاپەڕە .(٥٤)

★/-محمود دەرویش :-

١/-یومیات الحزن العادی .. الانحناء والدائرة ..لاپەڕە (٧٣).

٢/-دیوانە شیعری (مدائح لحصار البحر)لاپەڕە..(١٤-١٥).

★/-فؤاد رفقه:-

١/-گۆڤاری(الاقلام) ژماره (١)ی ساڵی (١٩٩٠).لاپەڕە.(٤٥-٤٦)

٢/-گۆڤاری (افاق العربیة)ی ژماره (١٢)ی ساڵی (١٩٩١)

لاپەڕە.(١٢٠)

٣/-گۆڤاری (افاق العربیة)- ژماره (١٢)ی ساڵی (١٩٩١)

★/  مشتێ هایكۆی یابانی :-

١-/ئەم كۆمەڵە هایكۆیە ،ساڵی (١٩٩٢)لەلایەن ،هاوڕێ یەكەوە بە فۆتۆكراوی ،پێم گەیشتووە ،نازانم لەكوێی وەرگرتووە ..؟

★/-یوجین گیلفك :-

١/- قصائد الكوارث والامل. یوجین گیلفك.دار الفارابي وەرگێڕانی بۆ عەرەبی :-(مصطفى محمود).

★/- صلاح ستیتیە :-

١/-صلاح ستیتیە .مختارات من شعرە ودراسات عنە . وەرگێڕانی بۆ عەرەبی(كاظم جهاد ) و ( ادونیس ) پیا چووەتەوە.لاپەڕە. (٣١ /٣٣ )

★-/ گۆڤاری(الثقافةالاجنبیة) ژمارە (٤/٣) ساڵی (١٩٩١) و.بۆ عەرەبی/محمد الظاهر ومنیە سمارە لاپەڕە (١٩٥)

★/- ابراهیم قازۆ :-

١/- مجلە ( المدى) ژمارە.(٢٢)/٢-(٢٠٠١).لاپەڕە..(٦٠)

★/-لیـــون فیلیب :-

١/-گۆڤاری (الادیب المعاصر )ی ژماره (٣٥-٣٦)ی شوباتی ساڵی (١٩٨٨) وەرگێڕان .و پێشەکی عەرەبی بۆ نووسینی (د.لوث گارسیا ڤسنطین)لاپەڕە(٦٦).

★/-سان ژۆن پێرس :-

١/- کیتابی (منفی،اناپاز، وقصائد اخری) وەرگێڕانی بۆ عەرەبی •علی اللواتی) ..ژمارەو ساڵی چاپ کردن و چاپخانە کەیم لا نیە ،تەنها چامەی (ئەناپاز)ـم لەلایە.بە فۆتۆ کراوی ..!

★/- عبد الوهاب البیاتی :-

١/-دیوانه شیعری (بستان العائشە) چاپی سێیەم ،چاپخانەی (دار الکرمل ) ساڵی(١٩٩١)..لاپەڕە.(٤٣).ولاپەڕە (٧٠)..

★/-ڤلادیمێر هۆلان :-

١/-القمم العالیه .مختارات من الشعر العالمی المعاصر .

-بغداد — دار المأمون للترجمة والنشر .ساڵی (١٩٩٢)

وەرگێڕان .وپێشەکی بۆ نووسینی،(یاسین طة الحافظ).لاپەڕە.(٢٥٦).

٭/-ئای کوانگ :-

١/-القمم العالية .مختارات من الشعر العالمي المعاصر .

-بغداد – دار المأمون للترجمة والنشر .سالي (١٩٩٢)

وەرگێڕان .وپێشەکی بۆ نووسینی،(یاسین طة الحافظ).لاپەڕە.(١٤٥).

٭/-ئونسیی الحاج :-

١/-ژمارە (یەك)ی .ڕۆژنامەی (المحرر)ی ئەردەنی.

٭/- غیورغ تراکل :-

١/-گۆڤاری (الاقلام) عیراقی ژمارە (٥) ساڵی (١٩٩٨)

و.بۆ عەرەبی (حسونە المصباحی ) لاپەڕە (١٣٢)

٭-/یانیس ڕیتسۆس / (( ایما ٔات ))

ترجمه /سعدی یوسف

مطبعة الآديب البغدادية –الطبعة الاولی لاپەڕە ( ٧٣-٧٤)